زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (15)

# هیتلەر

ئایڵین پیرسۆن        و: ئاگری ئەفشین



2017

**زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (١٥)**

**ناوی کتێب: هیتلەر**

**نووسەر: ئایلین پیرسۆن**

**و. لە فارسییەوە: ئاگری ئەفشین**

**ساڵ: ٢٠١٧**

**چاپ: ئەلکترۆنی**

## ناوەڕۆك:

## ڕایش هیتلەر

ئەڵمانیا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٣ تا ١٩٤٥ لە ژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی سەرکردەیەکدا بوو، ئەگەر بمانهەوێ باشتر و چاتر لە بارودۆخی ئەو وڵاتەو ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا ڕوویاندا تێبگەین، ئەوا پێویستە کاریگەری پتەوی هیتلەر لە خەڵکدا چاکتر بناسین. لە مانگی یەکی ساڵی ١٩٣٣ هیتلەر وەکوو وەزیری گشتی وڵات هەڵبژێردرا و تەنها ١٨ مانگ دواتر بەتەواوی دەستی بە سەر ئەڵماندا گرت. ئەڵمان لە ڕووی ئابووریەوە بوژانەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی و خەڵک متمانەیان پێ کرد. هیتلەر شانازی بە ڕایشەکەیەوە ( ڕایش واتە حکومەتی ئیمپراتۆری) دەکرد، کە هەزار ساڵ بەردەوامی دەبێت واتە درێژخایەنتر لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆم، بەڵام تەنها ١٢ ساڵی خایاند. ئەڵمان لە سەرەتاکانی جەنگی جیهانی دووەم سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێنا بەڵام لە کۆتایدا لە ساڵی ١٩٤٥ شکستی هێنا. سەرزەوی ئەڵمان لە لایەن بێگانەکانەوە داگیر کراو دواتر دابەش کرا بۆ ئەڵمانیایی ڕۆژهەڵات و ئەڵمانیایی ڕۆژئاوا. ١٢ ساڵ سەردەمێکی کورتە لە مێژووی هەر نەتەوەیەک، بەڵام ١٢ ساڵ ڕایشی هیتلەر پڕ بوو لە وورووژاندن، گۆڕان، سەرکەوتن و تێکشکان و ناکامی. ئەوەی لە ئەڵمانیا ڕوویدا، کاریگەریشی کردە سەر سیستەمی ئەوروپا و گیانی ملیۆنان مرۆڤی لە سەرانسەری جیهان ئەستاند.

## کەسایەتی هیتلەر

هیتلەر وەکوو سەرکردەیەک، سەرمەشق بوو بۆ ملیۆنان ئەڵمانی. تواناکانی ئەو لە سرنج ڕاکێشانی خەڵک سیحراوی بوون. زۆر کەس هەر کە دەیانبینی هۆگری دەبوون وەک ئەوەی جادوویان لێکرابێت. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هیتلەر تەنها ڕوخسارێکی ئاسایی هەبوو. پیاوێک بوو لە ڕووی خوو ڕەوشتەوەش ئاڵوگۆڕی زۆری بەسەردەهات. توانا و برستی دەگۆڕدرا بۆ تووڕەی، دواتر هاواری دەکرد، فرمێسکی هەڵدەڕژاند و پەنجەکانی گلۆڵە دەکرد بە مەست دەیکێشا بە مێزەکەدا. ئەم چالاکیە پڕ لە وزانەی لە یەک چرکەدا دەگۆڕدرا بۆ شانازیی.

ڕابردووی سەرەکی ژیانی ئەو لەو کاتەوە بوو کە ووتاری دەدا و خەباتی دەکرد دژ بە هەژاریی و نەداری. بەڵان لە ڕاستیدا بۆخۆی لە خێزانێکی پۆشتە و پەرداخ لە شارێکی بچوکی نەمسا گەورە ببوو. باوکی کارمەندی گومرگ بوو. هیتلەر بە هۆی تەمبەڵیەوە لە قوتابخانە لە تاقیکردنەوەکان ڕەدبۆوە. کەسێکی زۆر بزێو بوو و تەنها دوو یان سێ هاوڕێی هەبوو. لە تەمەنی ١٩ ساڵی سەفەری کرد بۆ ڤیەن، پایتەختی نەمسا. ئەم شارە هەتا دەهات و زیاتر بەرفراوان دەبوو و لە هەمان کاتیشدا ببووە شوێنێک بۆ خەڵکانی ناڕازی. هەندێک لەوانە بە دوای کەسانێکەوە بوون کە هۆکاری ئەم هەمووە بەدبەختیانەن و بە بێ هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و ئاشکرا هەموو خەتاکانیان دەخستە ئەستۆی جووەکان. هیتلەریش بەهەمان شێوە لەم ژینگەیەدا گەورەبوو و زۆری ڕەق لە جووەکان بوو و باوەڕی وابوو کە توندوتیژی و هێز تاکە چارەسەری بابەتە کۆمەڵایەتیەکانە.



هیتلەر، کە یۆنیفۆرمی نازی پۆشیوە و خاچی ئاسنینی بە خۆیەوە کردووە.

هیتلەر لە خزمەتی سەربازی هەڵات و هەتا شاری ڤیەنیشی جێهێشت و بەرەو ئەڵمان ڕۆشت.

جەنگی ساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٨ خاڵێکی وەرچەرخان بوو بۆ هیتلەر و لە جەنگدا مدالیایی خاچی ئاسنینی وەرگرت بە هۆی ئازایەتیەکەی. بەڵام بە تەواوی ڕەقی هەستابوو لەوەی کە ئەڵمانیا لە جەنگ خۆی بە دەستەوەدا، هەستی دەکرد خەیانەت کراوە لە دلێری و ئازایەتیەکەی. لەبۆیە بوو بە ئەندام لە حیزبێکی بچووک بە ناوی حیزبی سۆسیالیستی نەتەوەیی(نازیی) و یەکێك بوو لە قسەزان و قسەڕەوانەکانی ئەو حیزبە. هیتلەر هۆگری هێزی ووشە بوو و ئەمەش بە هێزترین چەکی ئەو بوو. لە پاش شکست خواردنی لە هەڵبژاردنەکانی مونیخ و لە دەستدانی حکومەت لە ساڵی ١٩٢٣، کەوتە زیندان و لەوێدا کتێبێکی نووسی بە ناوی (نەبەردی من). بیرۆکە سەرەکیەکەی ئەو لەم کتێبەدا ئەوەیە کە ئەڵمانیەکان ڕەچەڵەکێکی لەبەرترن و دەبێ حوکمڕانی جیهان بکەن. بە هۆی بارۆدۆخی سەختی ئەڵمان و دواتریش لە ساڵی ١٩٢٩ مەندی ئابووری سەریهەڵدا، هیتلەر دووبارە دەرفەتی سیاسەتی بەدەستهێناوە. باوەڕ و بڕواکانی هیتلەر لە دووبارە بونیادنانەوە و زیندووکردنەوەی ئەڵمان، پشتیوانێکی فرەی خەڵکی بۆ هێنا، بەتایبەت ئەوانەی کە پێیان وابوو کە ئەگەر هیتلەر نەگاتە دەسەڵات ئەوا کومونیستەکان دەسەڵات دەگرنە دەست. هەندێك لەم




ئەڵمان لە ساڵی ١٩٣٣

کەسانە هاوکاری هیتلەریان کرد بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست. هیتلەر لە ساڵەکانی ١٩٣٠ سەرکەوتنی زۆری بەدەستهێنا و لاینگرەکانی هەتا دەهات و زیادی دەکرد. هیتلەریان وەکوو سیمبول یاخود نموونەیەکی ئەڵمانی ڕاستەقینە و نیشتیمانپەروەر ناساند، و ئەویان وەکوو کەسێکی میهرەبان نیشان دەدا کە خۆشەویستی بۆ منداڵەکان و هەتا سەگەکانیش هەیە. لە ڕاستیدا ئەو کەسێکی سەیر و تورە بوو کە بەهێزترین پەیوەندیەکەی لە گەڵ ئاپۆڕەی خەڵك بوو. ئەو کاریگەریەی ئەو دەیکردە سەر ئاپۆڕەی خەڵك حەپەسێنەر بوو.

جێگری هیتلەر واتە، مارشاڵ گورینگ، پێی وابوو کە شوێنکەوتوانی هیتلەر ئاشقی ئەون و لەوباوەڕەدان کە هیتلەر نێردراوی خودایە کە هاتووە بۆ ئەوەی ئەڵمان ڕزگار بکات. هیتلەر لە هەموو کارە بنەڕەتیەکانی ناو حکومەت سەرکەوتوبوو. تێکشکانی لە جەنگدا کە لە ڕوسیا بوو لە ساڵی ١٩٤٢ ڕویدا جێگای باوەڕ نەبوو بۆ هیتلەر. ئیتر هیتلەر نەیتوانی ڕێبەرایەتی هیچ نەخشەیەکی هێرش کردن بکات. بەڵام هاواری دەکرد و دەیووت نابێ بکشێنەوە، دەیووت ڕووسیەکان هەموو مردوون، وە دەستوری پێشڕەوی بە سوپادا. لە ئەنجامدا ملیۆنان سەربازی ئەڵمانی کوژران. هەندێك لە ئەفسەرەکان کە نیگەران بوون بە هۆی ئەم بارودۆخەوە پلانیان کێشا کە هیتلەر بکوژن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. هێز و دەسەڵاتی بە خێرایی ڕووی لە



یەکێک لە دادگاکانی نازی

لەناوچوون کردو باوەڕی وابوو کە خەڵکی ئەڵمان خەیانەتیان لێکردووە. خەریك بوو شێت دەبوو کەسێکی وەسواسی لێدەرچووبوو، لە ژێرزەمینی بینای دادگای بەرزی بەرلین ژیانی بەسەردەبرد و هەر لەو کاتەدا کە لە گەڵ ئیڤابراون کە خۆشەویستی کۆنی بوو، هاوسەرگیری کرد. کاتێك ڕوسەکان لە شوێنی نیشتەجێبوونی نزیك بوونەوە، هیتلەر و ئیڤا خۆیان کوشت و لاشەکانیان سوتاندن.

## بارودۆخی ئەڵمان لە ساڵی ١٩٣٣

ساڵی ١٩٣٣ بۆ ئەڵمانیا ساڵێکی نائومێدی بوو. شەش ملیۆن کەس بێکاربوون. تەنها هیتلەر بوو کە قسەی لە مەڕ باشترکردنی بارودۆخەکە دەکرد. حکومەتی کۆماری دیموکراتیك کە لە ساڵی ١٩١٩ دوای تێکشکانی لە جەنگی جیهانی یەکەم چووە ناو پەیمانی ڤێرسایی. (بگەڕێوە بۆ کتێبی دوو جەنگی جیهانی لەم زنجیرەیە) خاڵە پەسەندکراوەکانی ناو ئەم پەیماننامەیە دادپەروەرانە نەبوو، نەلە گەڵ بارودۆخی کۆمەڵایەتی و نە لە گەڵ چارەسەرکردن و بونیادنانەوەی پیشەسازی ئەڵمانیش. حیزبی سۆشیال دیموکرات پشتیوانی لە حکومەتی کۆماری دەکرد، بەڵام کومونیستەکان و نەتەوەگەرەکان(ناسیۆنالیستەکان) بەرهەڵەستکاربوون. بەر لە ساڵی ١٩٣٣ حیزبی نازی توانی زۆربەی لایەنگرو ئەندامانی حیزبەکانی دیکەی ناسیۆنالیست بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت و ببێتە گەورەترین حیزبی ئەڵمان. بەڵام، پشتیوانی خەڵکی ئەوکاتە بە دەست هێنا، کە بە تەواوی دەسەڵاتی گرتە دەست.

لە ئەڵمان، حکومەت دەسەڵاتی زۆری هەبوو لە چاو وڵاتانی دیکەی ئەوروپا. حکومەت بانکەکان، وێستگەکانی کارەبا و هێڵەکانی گواستنەوەی لە ژێردەستدا بوو. هەتا دەستڕۆشتووی هەبوو لە دیاریکردنی نرخی کەلوپەل، و ڕۆڵێکی گرنگی هەبوولە کاروباری سەندیکاکانی

## ڕێکخراوی حیزبی نازی

ئا: ئەندامە سەرەکیەکانی حیزب و بەرپرسیاریەتی چالاکیەکانی ناو حیزب

(گائولیتز( ڕێبەرانی گائۆ(ناوچە ٤٢

کەریزلیتز (ڕێبەرانی کۆڕەکانی ناو گائۆ) ٧٦٠

ئۆرتیس (ڕێبەرانی گروپەکانی ناوچەیی لە ناو کەریز) ٢١٣٥٤

سیلواردین (ڕێبەرانی بەشەکانی سەرجادەکان) ٧٠٠٠٠

بلوك واردین( ڕێبەرانی بەشە بچوکەکان، وەکوو ناوچەی نیشتەجێبوون یان خانوو) ٤٠٠٠٠٠

ب: ئێس. ئا. و ئێس. ئێس

لەشکری ڕەشەبا(ئێس. ئا.) سوپای تایبەتی هیتلەر بوون. ئەندامانی ئەم سوپایە لە چینی کرێکار هەڵبژێردرابوون و (١ بیروباوەڕی سۆسیالیستسان هەبوو.

ئێس. ئێس. سەرباز و پاساوانانی بەرزتر بوون. ئەمانە پاسەوانی هیتلەر بوون و سوێندیان خواردبوو کە وەفادار بن بە (٢ هیتلەر.

ت: ئەو ڕێکخراوانەی کە پەیوەندیان لە گەڵ حیزبدا هەبوو

١)هێزی کار

٢)ڕێکخراەکانی نازیی مامۆستایان، پزیشکان، پارێزەران، پرۆفیسۆران، ئەندازیاران و کارمەندانی حکومەت

٣)بزوتنەوەی گەنجانی هیتلەر

کرێکاریی و ڕێکخراوە ئیداریەکان.  بە کورتی، هەر فەرمانەڕەوایەکی تاکڕەو یان دیکتاتۆرێك بە ئاسانی دەیتوانی جڵەوی کاروبارەکان بگرێتە دەست.

نازی کە بیروباوەڕی سۆسیالیستی هەبوو، بۆ زۆرێك لە خەڵکی مایەی خۆشحاڵی بوو، بەڵام هیتلەر لە ساڵی ١٩٣٣ حکومەتەکەی لە گەڵ ناسیۆنالیستەکان پێکهێنا. بەڵێنیان بە کاسبکارەکان دا کە بازرگانیەکانیان هەروا دەمێنێتەوە. زۆربەی ئەوانەی کە پشتیوانی هیتلەریان دەکرد کە لە هەژاریدا دەیاننالاند و ترسیان لە کومونیستەکان هەبوو. دروشمی هیتلەر بریتی بوو لە: کار، نان و داهاتوویەکی شکۆمەند بۆ ئەڵمانیا. هێز و کەسایەتی هیتلەریش خۆی لە خۆیدا دڵگەرمیەك بوو بۆ خەڵك.

## مسۆگەریی هێز

هیتلەر خوازیاری دەسەڵات بوو. ئەو ڕێبەرێك بوو کە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە دەسەڵاتی گرتبووە دەست و بە ئاسانی دەیتوانی خۆی لە بارودۆخی سەخت ڕزگار بکات. لەبەرئەوە دەبوایە دیموکراسی لە ناوبەرێت. پەرلەمان (ڕایشتاگ) لەم بارەوە هاوکاری هیتلەری کرد، بینای پەرلەمان پێشتر لە مانگی دووی ساڵی ١٩٣٣ بە هۆی سوتانەوە زیانی زۆری بەرکەوتبوو. ئەندامە دڵسۆزەکانی کۆمونیست لە پەرلەمان دەرکرابوون. لەبۆیە بە بێ هیچ مەرجێك یاسایەکیان تێپەڕاند، کە بە پێی ئەو یاسایە هیتلەر دەیتوانی بۆ ماوەی چوار ساڵ فەرمانڕەوایی بکات. تەنها سۆسیال دیموکراتەکان دژی ئەم یاسایە دەنگیان دا. ئێستا هیتلەر دەیتوانی دەست بە کاربێت. هیتلەر هەموو حیزبەکانی بێجگە لە نازی بە نایاسایی ئەژمارکرد. ڕایشتاگ یاسایەکی پەسەند کرد بۆ کاراکردنی بڕیارەکانی هیتلەر. لە ماوەی یەك ساڵ ڕێبەرانی حیزبی نازیی حکومەتی لە سەر بنەمایی هەڵبژاردن هەڵوەشاندنەوە و شوڕا ناوچەیایەکان لەناوچوون، هێز کەوتە دەست حیزبی نازی.



کاریکاتۆری جوویەك کە موزاحیمی ئافرەتێکی ئاریایی بووە.

ڕێکخراوی حیزبی کە هیتلەر لە ساڵانی پێشتر بەرنامەی بۆ داڕێشتبوو، هێزی گرتە دەست و ئەندامەکانی ئەو ڕێکخراوە تەواوی وڵاتیان خستە چنگی خۆیان. دەبوایە گائولیترەکان ئاگادارکرابانەوە لە چالاکیەکانی تاک بە تاکی خەڵکی ئاسایی و ئەو ڕێکخراوە لە خزمەت جێبەجێکردنی بڕیارەکانی هیتلەردا بوو.

یوزف گۆبڵز، وەزیری ڕاگەیاندن، ڕایگەیاند کە هیچ جێگەی ترس و نیگەرانی نییە. ووتی کە حیزب خەبات دەکات لە ڕێگای خۆشەویستی بۆ ئەڵمان، ئازادی و نان بۆ هەموو ئەڵمانیەکان و تێدەکۆشێت بۆ سوودو مەنفەعەت بۆ هەمووان لە جیاتی سوود بۆ لایەنێک. لە دوای بۆنەی سەرکەوتنی ڕۆژی نەتەوەیی کرێکار کە لە مانگی پێنجی ساڵی ١٩٣٣ بەڕێوەچوو، هیتلەر بڕیاریدا کە هێرش برنە سەر ئیدارەکانی سەندیکای کرێکاران و دەست بگرن بە سەر هەموو دارایی و بەڵگەنامەکانیان. هیتلەر هەموو ڕێکخراوەکانی خاوەن کارەکان و ڕێکخراوەکانی کرێکاری خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. بەم پێیە هەم لە ڕووی ئابووری و هەم لە ڕووی سیاسیشەوە ئێستا هێز لە چنگی هیتلەر دابوو.

## حیزبی نازیی و (شەوی چەقوە درێژەکان)

حیزبی نازیی بە تەواوی دزەی کردبووە ناو ژیانی خەڵکەوە هەموو پسپۆڕەکان ناچار بوون ببنە ئەندام لە ڕێکخراوەکانی نازی. مناڵەکان دەبوایە ببنە ئەندام لە ڕێکخراوی گەنجانی هیتلەر و گوێڕایەڵی بێ مشتومڕی سەروو خۆیان بن. حیزبی نازیی لە ڕێگەی بزوتنەوەی کرێکاری دەستوری بە کرێکارەکان دەدا کە بەرامبەر بە حیزب وەفادار بمێننەوە. پێگەی هیتلەر تەنها لە ناوخۆی حیزب هەڕەشەی لەسەر بوو، واتە لە لایەنی سوپای ڕەشەباوە(ئێس. ئا) کە ئەمانە لە هەوەڵەوە بە هۆی هێز و قودرەتی هیتلەر دەسەڵاتیان گرتە دەست. ئەندامانی ئەم سوپایە ئەیرەییان دەبرد بە ئێس. ئێس. کە دەسەڵاتیان زیادی کردبوو، و چاوەڕوانی دەرفەتێك بوون کە (کودەتای دووەم) ئەنجام بدەن واتە پێکهێنانی حکومەتێکی سۆسیالیستی کە پێشتر لە بەرنامەی حیزبدا باسی لێکرابوو.

هیتلەر بە هیچ شێوەیەك خوازیاری ڕاگەیاندنی حکومەتێکی سۆسیالیستی نەبوو، بۆیە فەرمانی بە ئێس. ئێس. دا کە تەواویی سەرانی ئێس. ئا. لە ناوبەرن. لە ١٩٣٤/٦/٣٠ ئەم فەرمانە جێبەجێ کرا و ئەم مێژووە بە ناوی (شەوی چەقوە درێژەکان) ناوبانگی دەرکرد. لەو کاتەدا وەلانانی نازیە توندڕەوەکان کە دەیانویست دەست بگرن بەسەر شوێنە پیشەسازیەکان، ئەوەی نیشان دا کە حیزبی نازی نایەوێ کۆنترۆڵی وڵات بگرێتە دەست.

## حیزب و حکومەت

ئەرکە حکومی و حیزبیەکان لە ئەڵمانی نازی چۆن لێك جیادەکرانەوە؟ لە ساڵی ١٩٣٥ هیتلەر ڕایگەیاند کە دەیەوێ حکومەت ئیدارە کردنی سازمانە حکومیەکان بگرێتە ئەستۆ و لە هەمان کات حیزبی نازیی فێرکاری ئامانجەکانی نازیی بە خەڵك بگرێتە ئەستۆ, واتە خەڵك لەسەر ئەوە ڕابهێنن بە بێ مشتومڕ گوێڕایەڵی فەرمانەکان بن.



ڕێبەرانی نازی، لە چەپەوە دکتۆر گوبلز ،بەڕێوەبەری بانگەشەکان، هیتلەر و هێرمان گورینگ جێگری هیتلەر

لە هەندێك بابەتی دیاریکراو ڕادەی کۆنترۆڵ کردن بە ڕۆشنی دیاریکرا. حیزب دەسەڵاتی باڵای هەبوو لە پەروەردەوفێرکردن، کەلتور و بەرفراوانکردنی دەستەی گەنجانی نازی و پەیوەندی پتەوی هەبوو لە گەڵ هێزی کرێکار. حکومەت، سوپا و خزمەتگوزاری گرتە دەست. لە شوێنەکانی دیکە هیچ ڕۆشن نەبوو کە کام لەم دوو هێزە، کۆنترۆڵیان لە دەستدایە. هەرلەبۆیە لە نێوان حیزب و سیستەمە حکومیەکان هەمیشە کێشمەکێشم هەبوو.

زۆرێك لە ئەندامانی حیزب پۆستی باڵایان لە دەزگا حکومیەکان وەرگرت. ئەندامانی ڕێکخراوی حیزبی هیتلەر کە دەچوونە ناو دەزگا حکومیەکانەوە خولیایەکی ئەوتۆیان بۆ کاروباری حیزبی و سیاسی نەبوو و زیاتر ئەوکەسانە بوون کە درەنگتر بونە ئەندام لە حیزبی نازیی. بەهەر حاڵ، لە پاش دەستپێکی جەنگ، تا دەهات و ئەندامی زیاتری ئێس.ئێس. پۆستی باڵایان لە ناو حکومەت وەردەگرت و هێزی زیاتریان بەدەستهێنا. کۆنترۆڵ کردنی



ڕیز ڕاوەستاندنی بەشێك لە سەربازەکان لە نورینبەرگ

ئەندامانی حیزب بۆ حکومەت کارێکی دشوار بوو، چونکە حیزب دادگای تایبەت بە خۆی هەبوو و لە کاتی سەرپێچی کردن، مافی هەبوو ئەندامانی حیزب لەو دادگایانەدا دادگایی بکات.

## یك خەڵك، یەك نەتەوە، یەك پێشەوا

هیتلەر بۆ ئەرخەیان بوون لە بەردەوامی دەسەڵاتەکەی، چاترین چارەسەری لە لا ئەوەبوو کە کۆنترۆڵی دڵ و مێشکی خەڵك بکات. بۆیە، ئەڵمانیەکانی بە ئاریایی ناوزەند کرد. ڕوخسار و شێوازی کەسێکی ئاریایی ڕاستەقینەی دیاریکرد: باڵابەرز، جوان، مووزەرد و چوارشانە. ئەو هەوڵی دەدا کە خەڵك باوەڕ بەوە بکەن کە خاك و خوێنی ئەڵمانیەکان، وای لێکردوون ببن بە میهرەبانترین و بە فەرهەنگترین خەڵکی سەر ڕووی زەوی، دەیووت ئەڵمانیەکان مرۆڤایانێکن کە گرنگترین و سەرەکترین بابەت لە لایەن خۆشگزەرانی کۆمەڵگایە و لە ڕووی ئەخلاقیەوە شایستەی ڕێبەرایەتی کردنی جیهانیان هەیە. هیتلەر دەیگووت دەکرێ مودارا بکرێت لە گەڵ ئەمریکیەکان و بەریتانیەکان، بەڵام سلاڤیەکان (واتە: ڕوسەکان، پۆڵەندیەکان، چکسلاوکیەکان) تەنها بە کەڵکی ئەوە دێن خزمەتکاری ئەڵمانیەکان بن. جووەکان و دۆمەکانی بە نیوە مرۆڤ دەزانی. وایدەبینی کە جیهان لە

ژێر فەرمانڕەوایی ئارییەکان سوودمەند دەبێت. لەبەرئەوە، هیتلەر پێی وابوو ئەرکی سەرەکی ئەو ئەوەیە کە هەموو ئەڵمانیەکان یەك بخاتەوە، هەتا ئەو ئەڵمانیانەی کە لە نەمسا و پۆڵەند و وڵاتانی دیکە دەژیان، باوەڕی وابوو کە ئەڵمانیەکان لە ژێر فەرمانڕەوایەتی ئەو، کۆمەڵگەیەك یاخود وڵاتێکی وا بونیاد بنێن کە بتوانن ڕووبەڕوی هەموو جیهان بنەوە.

بە هۆی پێکهێنانی بزوتنەوەی گەنجانی هیتلەری، حیزبی نازی بەرپرسیاریەتی ئەوەی هەبوو کە ئەرخەیان بێت لەوەی هەموو گەنجە ئەڵمانیەکان بیروباوەڕی هیتلەریان وەرگرتووە. لە تەمەنی ١٨ ساڵی گەنجەکان، زۆربەیان باوەڕیان بە نازی هێنابوو. کوڕان بۆ هەتاهەتایە چوونە ناو سوپای ئێس. ئێس. و هێزی کار. بیروڕایان وا بوو کە کۆمەڵگا تەنها دەبێت ئەو مرۆڤانەی تێدابێت کە لە ڕووی تەندروستی و جستەوە سەلامەتن، و ئەو گەنجانەی کە بە هێزن و خۆیان دەکەنە قوربانی ڕێگە و بیروباوەڕی هیتلەر. پیرەکان، ئەوانەی نەخۆشی دەرونی و پەککەوتەکان .هەموویان دەبوایە بە بێ ئازار کۆتایی بە ژیانیان هاتبوایە

## هاوڕێ و هاوکارەکانی هیتلەر

زۆربەی ڕێبەرانی نازی هیچ وێکچونێکیان دەگەڵ ڕەچەڵکی ئاریایی ڕەسەن نەبوو. و ڕەفتارو ڕەوشتیان هیچ هاوتایی نەبوو لە گەڵ خەڵکی کۆمەڵگەیەك کە دەیانووت بە فەرهەنگترین کۆمەڵگەیە. بەڵکوو زیاتر وەکوو گانگسترەکان(تاوانبار و چەتەو شتی وا) بوون. ئەوان خۆشیان لە بە کارهێنانی هێز و بازوو دەهات و هەر بۆیە بە خراپی کەڵکیان لە دەسەڵاتیان وەردەگرت. زۆربەیان لە گیرفانی خەڵك خۆیان دەوڵەمەند کرد. هێرمان گورینگ، زۆر تەمبەڵ و قەڵەو بوو، وجلی زۆر گرانبەهای دەپۆشی، میوانیی گەورەی دەگرت کە تێیدا خەڵك جلی سەردەمی چەرخی ناوینیان دەپۆشی. هاینریش هیملیر کە ڕێبەری ئێس. ئێس. بوو بە(نیمچە شێت) دەچوێنرا، شکڵی کەسێکی زوڵملێکراو و بێ زیانی هەبوو بەڵام بەرپرس بوو لە کوشتنی هەزاران بەندکراوی کەمپە بە زۆر ڕاپێچکراوەکان. ڕاین هارد هیدریش، کەمان(ڤیولین)ی دەژەنی بەڵام زۆر بە ئاسانی گوێڕایەڵی فەرمانی نابود کردنی ئێس. ئا.ی جێ بەجێ کرد کە هیچ هەستێکی نەبوو. لەم چەند کەسەی باسکران ئەمەیان لە هەموویان خوێندەوارتربوو. بەڵام لەبەر ئەوەی نەخۆشی ئیفلیجی هەبوو زۆر هەستی بە کەمی دەکرد. کاری ڕاگەیاندنی دەکرد و بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی بە بێ هیچ ویژدانێك ڕاستی شتەکانی دەگۆڕی.

## هیتلەر چۆن ئەڵمانی کۆنترۆڵ کرد؟

هیتلەر و هاوکارەکانی خەڵکیان سەرقاڵ کردبوو بە کار، چالاکیەکانی حیزبی، کۆڕوکۆبوونەوە و ڕیزبەستنی سەربازەکان. زۆرێك لە خەڵکی خۆشحاڵ بوون بە هۆی ئەوەی بەژدارن لە بونیادنانەوەی ئەڵمانێکی بەهێز. ووتەی سەردەکانیان لە پشت ڕادیو و بڵێنگۆ دەبووە هۆی هاندانی خەڵك، و هیچ ڕەخنەیەك لە حکومەت لە ڕۆژنامەکان چاپ نەدەکرا. ئالبێرت ئەشپییر ئەندازیار و شارەزایی ڕازاندنەوە و ڕێکخستنی کۆڕوکوبونەوەکان بوو. کۆبونەوەی مەیدانی و کۆکردنەوەی هەزاران سەرباز بە یۆنیفۆرمی نازی، هێزی



جووەکان لە پشت تێلدڕوەکانی ناو ئۆردوگا زۆرەملێیەکان

ئەڵمانی نوێی نیشان دەدا. هەتا ساڵی ١٩٣٦ زۆربەی خەڵکی ئەڵمان هەستیان بە ئاسایش و ئارامی دەکرد. لوید جۆرج سەرۆك وەزیرانی ئینگلتەرا کاتێك لە ساڵی ١٩٣٦ چوو بۆ ئەڵمان دواتر لە نوسینەکانیدا ستایشی ئەڵمانی دەکرد. کاری وەبەرهێنان بۆ ئەو کەسانەی کە دژ بە حکومەت بوون زۆر ئەستەم بوو، چونکە شێوازی کۆنترۆڵ کردنی دیکەش هەبوو. گشتاپوو( پۆلیسی نهێنی) بە ئاسانی شوێنی ئەو کەسانەی دەدۆزیەوە کە دژ بە حکومەت بوون. ئێس. ئێس. دەورەی فێرکاریان دەبینی بۆ گوێڕایەڵی فەرمانەکەکان و کاری توندوتیژی و هەموو ئەو کەسانەیان تۆقاندبوو کە ناکۆك بوون لە گەڵ سیستەم. ئەم گەنجانە جلو بەرگی نازیان لەبەربوو لە کۆڵانەکان دەسوڕانەوە ئاوازی ترسناکیان دەخوێند. زۆربەی جار ئەم ئاوازانە دژ بە جووەکان بوو. کاتێك فەرمانیان پێکردبان، ئەوا هێرشیان دەبردە سەر خەڵك و لێیان دەدان و ئازارو

ئەشکەنجەو کوشتاری خەڵکیان دەکرد. دادگای خەڵك دادوەرێکی ترسناکی هەبوو بە ناوی فویزلەر، ئەویش هیچ پشتیوانیەکی لە خەڵکی ستەم لێکراو نەدەکرد. ئەم کەسانە کە دەبرانە دادگا، پاشان دەنێردرانە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکان بۆ کاری سەخت یان دەنێردران بۆ تاقیگە پزیشکیەکان بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەیان لەسەر بکەن، دواتر دەنێردرانە ژووری گاز و لە کۆتایدا بۆ گۆڕی گەورەی بە کۆمەڵ ڕەوانە دەکران. کۆمونیستەکان و ئەندامانی سەندیکای کرێکاری، کرێکارانی بەرهەڵستکار و هەزاران جوو ڕاپێچی ئەم ئۆردوگایانە کران. زۆربەی ئەوانە لەم ئۆردوگایانە گیانیان لە دەستدا.




کارو بێکاری لە ساڵەکانی ١٩٣٠ تا ١٩٣٨

## کارکردن لە قەڵەمڕەوی حکومەتی (ڕایش)

هیتلەر، یاڵمار شاختی کردە بەرپرسی کاروباری دارایی وڵات. ئەویش بە خێرایی (نان و کاری) بۆ خەڵك ڕەخساند. ڕێژەیی بێکاری لە ساڵی ١٩٣٣ نزیکەی ٦ ملیۆن نەفەر بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٣٩ ئەم ڕێژەیە نزم بوویەوە بۆ نیو ملیۆن نەفەر. خەڵك لە حیزبی نازی، لە پرۆژەکانی حکومەت کاریان دەکرد وەکوو: بینای گەورە و ڕێگاوبان و هەوەڵین ئوتوبانی جیهان. هەروەها لە کارگەی چەك دروستکردن کاریان دەکرد کە بە دەست خێزانی کروپەوە بوو. باقی خەڵکەکەی تریش بوونە ئەندام لە گشتاپوو، ئێس.ئێس. و دواتر لە ساڵی ١٩٣٥ بوونە ئەندام لە سوپا.

لە ناوەڕاستەکانی ساڵەکانی ١٩٣٠، کار ڕووی لە کەمی کردبوو. ئەو کرێکارانەی کە لە کارگە گرینگەکان کاریان دەکرد، ئەگەر ویستبایان کارەکەیان بگۆڕن دەبوایە ئیزنیان وەرگرتبا. مووچەی کرێکارەکان زۆر نەبوو بەڵام وەرەی باشیان هەبوو. پیشەسازی تا دەهاتوو گەشەی دەکرد و ژنەکانیش لە شوێنی کارکردن ڕووی لە زیادبوون دەکرد. بۆ خۆبەڕێوەبەری ئابووری، هەندێك لە مادەکان وەکوو پلاستیك بە شێوەی دەستکرد بەرهەم دەهات.

بە هۆی کاری بانگەشە کردن ڕێژەی وەبەرهێنان ڕووی لە زیادبوون کرد. ئەگەر کرێکارەکان لەم بزاڤە بەشداریان کردبا، دەیانتوانی ببنە خاوەن ئوتومبێل، خانوو، بلێتێکی سەفەرکردن لە ڕێگەی دەریا یان بلێتی شانۆ. هەرچەند کە ڕێژەی ماڵیات زۆر بوو، بەڵام ئەم بەرنامەیە هاندەرێکی باش بوو بۆ کرێکارەکان. بازرگانیە بچوکەکان زیانی زۆریان بەرکەوت و تەنها لە شاری بەرلین نزیکەی ١٠٠٠٠ بازرگانی بچووك مایەپوچ بوون. خاوەنەکانی ئەم بازرگانیە بچوکانە کێشرانە ناو پیشەسازی چەك. کاری لادێکان زۆرجار لە لایەن پیاوانی کەم تەمەن بەڕێوەدەبرا کە بۆماوەی شەش مانگ دەچوونە خزمەتی سەربازی. ئەوان لە ئوردوگا سەربازیەکان ژیانیان بەسەردەبرد. کشتوکاڵ لە ئەڵمانیا تاڕادەیەك دواکەوتوو بوو. یاسای میراتی کێڵگە ڕێگری کرد لە دابەش کردنی زەویە کشتوکاڵیەکان بۆ بەشی بچوکتر. پێداگری لەسەر ئەوە کرد کە زەویە کشتوکاڵیەکان دەبێت بدرێت بە کوڕی گەورەی خێزان بەومەرجەی کوڕەکە شایستەی کشتوکاڵ کردن بێت.




ڕێکلامی ڤۆلکس ڤاگن(ئەگەر دەتانەوێ ببنە خاوەن ئوتۆمبیل ئەوا هەفتەی ٥ مارك پاشەکەوت بکەن.

بۆ ئەوەی ژیان لە لای خەڵك خۆشەویستر بێت، حکومەت کتێبخانە، یانە و شوێنی ڕابواردنی کردەوە. بەڵام لە گەڵ هەموو پێشرەوییەکان، کرێکارەکان زەویەکانیان جێهێشت و ڕوویان کردە کارگەکەکانی چەك دروستکردن، چونکە داهاتەکەی باشتر بوو. لە گەڵ سەرهەڵدانی جەنگ، جوتیارانێکی زیاتر ڕوویان کردە کارەگەکانی چەك دروستکردن و زۆربەی کێڵگەکان لە لایان ژنەکانەوە بەڕێوەدەچوون، هەروەها بەندکراوەکانی جەنگ و کۆیلەکانی ڕۆژهەلاتیش(ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا ) لە سەر ئەم زەویانە کاریان دەکرد. ئەم کۆیلانە لە پیشەسازی و زەویە کشتوکاڵیەکان وەکوو ئاژەڵ مامەڵەیان لە گەڵ دەکرا و هیچ گرنگیەك بە ژیانیان نەدەدرا.

## خێزان

بە بڕوای نازیەکان، ئامانجی سەرەکی هاوسەرگیری دروستکردنی خێزانێکی گەورەو سەلامەتە بۆ دابین کردنی هێزی کارو سوپا. ئەوانەی نەیاندەتوانی منداڵی سەلامەت بهێننە دونیاوە زۆرجار نەزۆك دەکران واتە ئیتر ڕێگەیان نەدەدا منالیان بێت. گوشاریان دەخستە سەر ژن و پیاوەکان بۆ ئەوەی لە کاروباری هاوسەرگیری و پەروەردەی خێزان زیاتر تێبکۆشن. ژنی عازەب و ئەو ژنانەی کە منالیان نەبوو بە مرۆڤی پلە دوو لە قەڵەم دەدران. پێوەری منداڵبوون پەیوەست کرا بە کەم کردن و زیادکردنی ڕێژەی دارایی. قەرزیان دەدا بەو کەسانەی کە هاوسەرگیریان دەکرد، و هەروەها یارمەتی دارایان دەدا بەو خێزانانەی کە چوار منداڵی خوار تەمەنی ١٦ ساڵانەیان هەبوو، هەموو ئەمانە بۆ ئەوەبوو کە ئەڵمانیەکان وەچەی زیاتر بخەنەوە. لە ساڵی ١٩٣٩ بە دواوە ساڵی جارێك مەدالیای خاچی شانازی دەدرایە دایکان، ئەم خاچە بە تایبەتی دەدرانە ئەو دایکانەی کە خێزانی گەورەیان هەبوو. ئەم ژنانە لە لایەن خەڵکەوە ڕێزێکی زۆریان لێدەگیرا، لە ناو خەڵکدا شوێنی تایبەتی خۆیان هەبوو. نازیەکان خۆشیان لە ژنێك دەهات کە تەنها لە ماڵەوە بێت و نە جوانکاری بکات و نە بە دوا جل و مۆدەوە بێت، لە گەڵ ئەمانەشدا خۆشیان لە کتێب خوێندنەوەش نەیەت. بەڵام لە گەڵ ئەم باس کردنانەش ژنان ناچار دەکران کرێکاری بکەن بە تایبەت لە سەروبەندی جەنگدا، کە بەو هۆیەوە زیانی جەستەیان پێکەوت و ئیتر دووبارە وەچەخستنەوە بەرەو دابەزین چوو. لە ناو خێزانە ئاینیەکان، پەیوەندی نێوان دایك و باوك و منالەکانیان بە




تایبەت ئەو منالآنەی لە ناو بزوتنەوەی گەنجانی هیتلەری بوون بەرەو خراپی چوو. لە بنەڕەتدا خێزان ببوە بەشێك لە دەوڵەت، ئیتر پەیوەندی ناوخۆیی و تایبەتی خێزان ئەو مانا تایبەتیەی خۆی لە دەست دابوو.

## بزوتنەوەی گەنجانی هیتلەری

هیتلەر خوازیاری ئەوەبوو کە گەنجانی نەوەی نوێ، گەنجانێك بن خزمەتکاری نازی و وەفادار بە هیتلەر. زۆربەی چالاکیەکانی ڕۆژانەی گەنجان دەکەوتنە دوای تەواو بوونیان لە قوتابخانە. وەرزش لە هەوای ئازاد و کەمپینی تەندروستی لەش، گەرەنتی بوو بۆ پاراستن و گەشەکردنی ورەی کۆمەڵایەتی گەنجان. ئەوان دەبوایە وانەکانی نازی فێربوونایە و جلوبەرگ(یۆنیفۆرمی) نازیان پۆشیبا و سوێندیان خواردبا کە بە هیتلەر وەفادار بمێننەوە. لە ڕیز وەستانی ئەم گەنجانە لە سەربازی دەبینرا منالآنی دە بۆ دوانزە سالآنەی تێدابوو کە دایکان سامیان لێ نیشتبوو. کوڕان و کچانی ١٤ بۆ ١٨ سالآن لە بزوتنەوەی گەنجانی هیتلەری لە وەرزش و مۆسیقا و کۆکردنەوەی پارە لە وەرزی زستاندا پێشبڕکێیان لە گەڵ یەك دەکرد. ئەم جۆرە کارانە هەموو کاتەکەی ئەوەنی گرتبوو بەڵام گەنجانێکی گۆێڕایەڵیان لێدەردەچوو. لە تەمەنی ١٨ساڵی زۆربەی ئەم گەنجانە، دەبوونە نازیەکی دەمارگیر. ئەمانیش وەکوو سوپا و ئێس.ئێس. بە خۆشحاڵی و تامەزرۆیەوە لەم ڕیزبوونە سەربازیانەدا بەژداریان دەکرد. باڵدور فۆن شیراك ڕێبەری گەنجان بوو، کەسێکی ئارام دەهاتە بەرچاوان. ئەم گەنجانە سلآویان بۆ پێشەوایان دەناردو سرودی دژ بە مەسیحیەتیان دەگوتەوە، و بەم کارانەیان هەستیان بە گەورەیی و گرنگی دەکرد. زۆرێك لە دایکان و باوکان نیگەران بوون سەبارەت بە لاوەکانیان، چونکە توندوتیژی زۆر ڕەواجی پەیداکردبوو لە نێوان گەنجان، بەڵام ئەمە دونیای گەنجان بوو و ئەوان تامەزرۆی ئەم کارە بوون.

## ڕێنوێنییەکانی نازی

قوتابخانە ئەڵمانیەکان کاریان تەنها ئەوەبوو کە نازی باش و گوێڕایەڵ بەرهەم بێنن. لە قوتابخانەی ڕۆژانە و شەوانەش هەموو قوتابیەکان وانەی پەیوەست بە لەپێشتر بوونی ڕەچەڵەکی ئاریان دەخوێند و هەروەها بنەماکانی



وتاری هیتلەر بۆ بزوتنەوەی گەنجانی نازی

ناسیۆنالْ سۆسیالیزمیشیان فێردەکردن. هەروەها وانەکانی دیکەی وەکوو بیرکاری و مێژوو لە بەرچاو گیرا بوو کە زیاتر پشتیوانی ئەم جۆرە بیروباوەڕیان دەکرد. کوڕان زیاتر فێری میلیتاریزم (چەکداری) دەکران. و کچان فێری ماڵداری و بەخێوکردنی منالْ دەکران. وانەکان لە کاتژمێر یەکی دوانیوەڕۆ کۆتایی پێدەهات، بەڵام وەرزش و چالاکی حیزبی لە دوای کاتژمێر یەکەوە دەستی پێدەکرد. چالاکی ڕۆشنبیرانە هەڕەشەی توندی لەسەربوو. ئاستی فێرکاری بە خێرایی دابەزی، هەتا لە قوتابخانە تایبەتیەکان و زانکۆکانیش بە هەمان شێوەبوون. مەرجەکانی چوون بۆ زانکۆ بریتی بوو لە ، تەندروستی، ڕەسەنایەتی و وەفاداری بە بنەماکانی نازی. تەنها ئەو کتێبانە دەخوێندران کە حیزب ڕێگەی پێدەدان. بۆ مامۆستاکانیش، بوونە ئەندام لە ڕێکخراوی مامۆستایانی نازی گرینگتر بوو لە بوون بە مامۆستای باش و کارامە. ئەم ڕێگاو ڕەوشەی خوێندن بووە هۆی دابەزینی دەستکەوتنەکانی زانست، بە پێی یاسای بزوتنەوەی گەنجانی هیتلەر ئەو گەنجانەی کە خاوەن بەهرە بوون لە چالاکیە حیزبیەکان دەبەخشران بۆ ئەوەی لە سەر خوێندنەکەیان بەردەوام بن، بەڵام هێشتا ئاستی خوێندن بەرەو دابەزین دەچوو.

## کەلتور و سەرگەرمی

هەموو شێوەکانی هۆنەر و سەرگەرمی لە خزمەتی حکومەتی نازیدا بوون. زۆربەی ئەو چالاکیانە ئەوەندە ساردوسڕ بوون کە هیچ هەستێکی لە لای مرۆڤ دروست نەدەکرد. لە ساڵی ١٩٣٣ ئەو کتێبانەی کە تێیاندا شتیان دژ بە نازیەکان لیَ نووسرابووەوە، سوتێندران. ئەم کارانە

سەرمەشقی ڕەفتاری نازیەکان بوو. چاپخانە و ڕادیۆ سانسۆریان خرایە سەر، شانۆکان تەنها دیمەنە کلاسیك و بێ مەترسیەکانیان نیشان دەدا، لە فیلمەکانیش پاڵپشتی لە نازیەکان دەکرا. موسیقا کە لە شوێنە گشتیەکان بەڕێوەدەچوو، یا سرود بوو یان موسیقای نیزامی. پێشانگا هونەریەکان ڕەنگدانەوەی سەلیقەی هیتلەر بوون لە وێنەکانیاندا. زۆرێك لە کارە داهێنەرەکان کە دەنێردران بۆحکومەت پشتگوێدەخران، بەڵام زۆرێك لە هونەرمەندان و نووسەران بە نەهێنی بەردەوام بوون لە سەر کارەکانیان بە ئاواتی گەڕانەوەی ئازادی.

## ئایین

بیروباوەڕی نازی وەکوو ئاینێکی نوێ بوو. نازیەکان پێیان وابوو کە ئاینە کۆنەکانی وەکوو مەسیحیەت کاتیان بەسەرچووە و بە کەڵك نایەن چونکە ڕێگری دەکەن لە گەشەی تواناکانی مرۆڤ. لەبەرهەندێ دژایەتی و ناکۆکی کەوتە نێوان کەلیسا و نازییەکان. کاردینالّ فول هابیر لە کەلیسای ڕومای کاتۆلیك ڕەخنەی لە بیرۆکە ڕەگەزپەرەستانەکانی هیتلەر گرتوو و ووتی مەسیحیەت لە سەرووی ڕەچەڵەکەوەیە و هەموو مرۆڤەکان بە یەکسان دادەنێت. ئەو خوازیاری ڕێزلێنانی جووەکان بوو و ئەوەشی دا بە گوێی خەڵکدا کە مەسیحیەت لە ناو دینی یەهودیەوە هەڵقولاوە. هەندێکی دیکە لە پیاوانی کەلیسا خۆشحالّ بوون بە ئیمپراتۆریەتی نوێی هیتلەر. پرۆتستانەکان، کە خوازیاری یەك کەلیسا بوون بۆ هەموو ئەڵمان، بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی کەلیساییان لە تورنیگیا دروستکرد. لە گەڵ بیروباوەڕە دژ بە مەسیحیەکان لە لایەن گەنجانی هیتلەریەوە، کەچی لە هەندێك کەلیساکان دوعایان بۆ دەکردن. ئەو منالّانەی کە بۆ نان خواردن بانگێشت دەکران لە لایەن نازیەکانەوە، بۆ نانی ڕۆژانەیان لە جیاتی خودا سوپاسگوزاری هیتلەر بوون. هەندێك لە مەسیحیەکان وا بیریان دەکردەوە کە هیتلەر بۆ مسیحیەت لە کومونیستەکان باشترە و ڕێزیان لە هیتلەر دەگرت لەبەرئەوەی ئەو پارێزگاری لە کولتوری ئەورویا دەکات. ئەو پیاوە ئاینیانەی کە دژ بە بزوتنەوەی گەنجان قسەیان دەکرد، ڕاپێچی ئۆردوگا زۆرەملێیەکان دەکران. تا ساڵی ١٩٤١ هیتلەر پێی وابوو کە ئەم کێشەیە بە سانای و بە ئارامی چارەسەر دەکرێت. ئەو دەیگوت ئەم نەوەی کە ئێستا پێدەگات زۆر گرنگی بە کەلیسا نادات و لەمە بە دواوە چوون بۆ بۆنە دینیەکان لە کەلیسا تەنها بۆ بەساڵاچوانە ... و لە کۆتایدا کەلیسا لە ناو دەچێت. لە هەمان کاتدا بت پەرەستی ڕواجی پەیدا دەکرد. کچان بە جلوبەرگی بت پەرەستیەوە دەچوون

بۆ جێژنی درەو (harvest home) و

بینای بزوتنەوەی گەنجانی هیتلەری بە نوسینی ووشەی بت پەرەستی ڕازێنرابویەوە.

## جووەکان

لە ساڵی ١٩٣٣، چەندین ملیۆن جوو لە ئەڵمان بوون. زۆربەی ئەوان کەسانی چالاك و کاسب و دەوڵەمەند بوون، و زۆر سەرکەوتوبوون لە کارەکانیان کە ئەڵمان دەیتوانی سوود لە هێزی کارو تواناکانی وەرگرێت. بەڵام بانگەشەی دژەیەهودی زۆر بە قوڵی ڕەگی داکوتابوو کە جووەکانی بە مایەی شەڕ و کەمتر لە مرۆ تەماشا دەکران. هەروەها



شانۆی گروپی بت پەرەستەکان کە سرنجی خەڵکیان ڕاکێشاوە.

یەهودیەکانیان بە خەتابار دەزانی لە تێکشکانی ئەڵمان لە جەنگی جیهانی ئەوەڵ و قەیرانەکانی ساڵی ١٩٢٠ بە دواوە. جووەکان هێرشیان دەکرایە سەر بە ناوی ئەوەی کە کومونیستن یان سەرمایەدارن. بە خەڵکیان دەوت کە لە دوکان و بازاری یەهودیەکان شت نەکڕن. جووەکان لە هەموو کارە حکومیەکان وەدەرنران و ڕێگەیان پێنەدرا چالاکی کەلتوریان هەبێت.

لە ساڵی ١٩٣٥ یاسای نۆرێنبرگ مافی هاوڵاتی بوون لە جووەکان سەندەوە و هاوسەرگیری جووەکانی لە گەڵ خەڵکانی دیکە قەدەغە کرد. ئەوانەی کە زووتر هەستیان بە مەترسی کرد وڵاتیان جێهێشت و هەموو سامانەکەیان کەوتە دەست حکومەت. لە گەڵ ئەم حاڵەشدا و لە دوای (شەوی بلوور) لە ساڵی ١٩٣٨، واتە ئەو شەوەی هەموو دوکانەکانی یەهودیەکان بەردباران کران، هەندێك لە یەهودیەکان هێشتا ئومێدەواربوون بارودۆخە باشتر دەبێتەوە. بەڵام بە پێچەوانەوە گروپ گروپ ڕاپێچی ئۆردوگا زۆرەملێیەکان دەکران. لە گەڵ بەرفراوانبوونی هێز و دەسەڵاتی ئەڵمانیەکان، جووەکانی وڵاتانی دیکەش ئاسایشیان نەبوو. لە پۆڵەندا، ناوچەی جووەکان یان گیتۆ، بوو بە زندان و لە زۆربەی شوێنەکان وەك گۆڕستانێکی لێ هات. لە ساڵی ١٩٤١ هەموو یەهودیەکانی سەروو ٦ ساڵان ناچار کران ئەستێرەی داود بە خۆیانەوە هەڵواسن. لە ساڵی ١٩٤٢ ڕێبەرانی نازی (کۆتا ڕێگە چارەیان دۆزیەوە): کوشتاری هەموو یەهودیەکانی ئەوروپا... کوورەی گاز لە هەموو ئۆردوگاکان بە کارهات و شەش ملیۆن جوو لە ناوچوون.



بینایەك کە بانگەشەی دژە یەهوودی لەسەر نووسراوە.



وێنەی منالآنی یەهودی، کە دەموچاوی ترساویان و لە جلوبەرگی شڕو دڕاو لە ئۆردوگاکان نیشان دەدات.

## جەنگ و ئاسەوارەکانی

لە ساڵەکانی ١٩٣٨ و ١٩٣٩ سیاسەتی هیتلەر لە سەر بنەمای یەکگرتووی هەموو ئەڵمان بوو بە یەکگرتووی لە گەڵ نەمسا و هێرش کردنە سەر چیکۆسلۆڤاکیا و پۆڵەند. ئیمپراتۆریەتی گەورەی ئەڵمان بوو بە ڕاستی. سیستەمی نوێی هیتلەری هەوەڵین جار بە سەر وڵاتی پۆڵەندا سەپێنرا. ئامانج لەم پلانە ئەوەبوو کە وڵاتە داگیرکراوەکان، بە تایبەتی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات، بکەونە بارودۆخێکی خراپ و نالەبار بۆ ئەوەی سەرچاوەی سروشتی و سەرچاوەی مرۆیی ئەوان ببنە خزمەتکار و ژێردەستەی ئەڵمانیەکان و سوودیان لێ وەرگرن بۆ خۆیان. بەڵام، داگیرکردنی پۆڵەندا بووە هۆی جەنگ لە گەڵ بەریتانیا و فەرانسە. پێویستی خۆبەڕێوەبەری ئابووری، پێویست بە ئامراز و کەرەستەی جەنگی و پێویست بوون بە شوێنی زیاتر بووە هۆی ئەوەی ئەڵمانیا هەوڵی داگیر کردنی ڕوسیا بدات. ( بگەڕێوە بۆ کتێبی دوو جەنگی جیهانی لەم زنجیرەی) هیتلەر دەیویست زەویەکانی گەنمی ئۆکراین و کێڵگە نەفتیەکانی قەفقاز بە دەست بێنێت. لە مانگی دوانزەی ١٩٤١ کە ئەڵمانیا ئەرخەیان بوو بە پشتیوانی ژاپۆن لە زەریایی هێمن، جەنگی دژی ئەمریکا ڕاگەیاند.

کارگەکان، شارەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەڵمان بە قورسی بۆمباران کران. ڕێژەی وەبەرهێنان بە سەختی زیانی پێکەوت. تێکشکاندنی ئەڵمان لە ڕوسیە، هاتنە ناوەوەی فرۆکە جەنگیەکانی بەریتانیا و ئەمریکا لە فەڕانسە لە ٦/١٩٤٤، تێکشکانی یەکجاری هیتلەری نزیکتر کردەوە. هیتلەر فەرمانی کرد هەموو دەزگا و ئامێرەکان لە ناوبەرن. هەندێك لە ئەفسەرەکان سەرپێچیان لەم فەرمانە کرد.



ئەستێرەی سووری پێنج گۆشە،

نیشانەی کومەنیستەکانی ڕوسیا

ئەستێرەی زەردی شەش گۆشە

نیشانەی یەهودیەکان کە لە سەرووی شەش ساڵەوە ئەبوایە ئەمەیان بە خۆیانەوە هەڵواسیبا.

لە زۆرێك لە پۆستێر و کاریکاتۆرەکان وێنەی یەهودیەکانیان بە ئەستێرەی سوور نیشان دەدات، کە نیشانی بدەن یەهودیەکان کومونیستن.

## حکومەتی ئیمپراتۆریەتی هیتلەر لە مێژووی جیهان

بۆچی دەبێ سەردەمێکی خراپی ئەڵمانی ژێر دەستی هیتلەر وەخوێنین؟ هەوەڵ لەبەر ئەوەی کە ئەڵمانیەکان زۆر شتیان گۆڕی ولە سەردەمی جەنگ کوشتارێکی زۆریان کرد بە تایبەت کوشتاری جووەکان-کەوابوو دەبێ بپرسین لەبەر چی؟ دووهەم دەبێ بزانین لەبەر دەسەڵاتخوازی هیتلەر بوو کە جیهانی ئەمرۆ ئەم شکڵەی بە خۆوە گرت. جەنگی جیهانی دووەم بۆ تێکشکاندنی هیتلەر بوو.



چێکسلاوکیەکان تووڕەی خۆیان دژ بە سەربازە ئەڵمانیەکان نیشان دەدەن.




فراوانترین سنووری ڕایش لە ساڵی ١٩٤٢

تێکشکان و دابەش کردنی ئەڵمان، بووە هۆی ئەوەی کە ڕوسیا ببێتە بەهێزترین وڵاتی ئەوروپا و ئەوروپای ڕۆژئاوا دەستی هاوکاری بۆ ئەمریکا درێژ بکات. بەم پێیە بوار بۆ جەنگی سارد ڕەخسا( بگەڕێوە بۆ جەنگی سارد لەم زنجیرەیە). سێهەم ئەوەی کە، تێکشهانی پلانەکانی هیتلەر، نەخشەی هەموو ئەوروپای گۆڕی. ئەڵمانیا دابەش کرا بۆ دوو بەش. موستعمەراتی ئەڵمانی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات لە ناو چوو. چکسلاوکیەکان، پۆڵەندیەکان و خەڵکانی تریش کە لە دەست ئەڵمانیەکان وەزاڵە هاتبوون، ئەڵمانیەکانیان لە وڵاتەکانی خۆیان وەدەرنا. چوارەم ئەوە کە تێرامانێك لە ئیمپراتۆریەتەکەی هیتلەر لەوانەیە لە سەرێکەوە دەرسێك بێت بۆمان. لە یەکێك لە کتێبەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیە بە ناوی (گەشەی دەوڵەت) باس لە هێز و بەڕێوەبردنی دەوڵەت دەکرێت. لە سەدەی بیستەم، دەوڵەت لە بارەی کۆنترۆڵ کردنی خەڵکەوە نوێخوازی بە خۆیەوە بینی" بەڵام خودی دەوڵەت کێ کۆنترۆڵی دەکات؟ لە وڵاتانی دیموکرات دەبێ خەڵك دەوڵەت کۆنترۆڵ بکات.

لە ئەڵمان دەستەیەك کە خۆیان لە خەڵك پێ ئاقڵترو تێگەشتوتر بوو، کۆنترۆڵی دەوڵیان گرتە دەست. ئەم گروپە قەناعەتیان بە زۆر خەڵك کرد کە ووتەکانیان ڕاستە. بەم پێیە حیزبی نازی کۆنترۆڵی گرتە دەست و هەرشتێك حیزب بە ڕاستی زانیبایە جێ بە جێی دەکرد. هەموو ئەم ئەنجامە سەرسوڕهێنەرانە دەبێت دەرسێك بێت بۆ ئێمە و یارمەتیدەر بێت بۆ ئەوەی بەرنامەیەك دابڕێژین بۆ حکومەتێکی نوێ و چۆنیەتی سوود وەرگرتن لێی بە شێوەیەکی وردتر.

حکومەتەکەی هیتلەر لە زۆرێك لە بوارەکان هاوشێوەی باقی وڵاتانی نێوان دوو جەنگی جیهانی بوو. کەوتبووە ژێر کۆنترۆڵی دیکتاتۆرێك، تەنها جیاوازیەکەی باوەڕبوونی هیتلەر بە ڕەگەزپەرەستی و لە پێشتری ڕەچەڵەکی ئاریایی و دەرئەنجامە خراپەکانی ئەم ڕەگەزپەرەستیە یەقەی جووەکان و ئەوروپای ڕۆژهەڵاتی گرتەوە. لە هەموو ئەو وڵاتانەی داگیر کرابوون، کەسانێك بوون کە ڕێزیان لە هیتلەر دەگرت و خۆشیان دەویست. بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە کەسانێك هەبوون کە هەموو ژیانیان تەرەخان کرد بۆ دژایەتی و لەناوبردنی هیتلەر.

ئەوەی وشیارکەرەوەیە، ئەو ئاسان باوەڕکردنەی خەڵك بوو بە هیتلەر کە ئاوا بە ئاسانی دەستیان لە ئازادی خۆیان




ئەڵمانیای دابەشکراو و داگیراو لە ساڵی ١٩٤٥

هەڵگرت. کاتێك لەبارەی کارەساتەکانی هیتلەرەوە دەخوێنیەوە، لەوانەیە بە خۆت بڵێی چۆن خەڵك چوونە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەکی ئەوها. یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکان، هێزی سەربازی بوو. پۆلیس و سوپا لە دەستی حکومەتدا بوو. هۆکارێکی تر ئەوەیە زۆربەی ئەڵمانیەکان گوێڕایەڵی یاسا بوون و خوازیاری شۆڕش نەبوون. هۆکاری سێیەم ئەوەیە کە زۆربەی خەڵکی ئەڵمان وایاندەزانی کە هیتلەر ئەڵمانی ئاوەدان کردیتەوە و وڵاتی لە قەیرانەکەی ساڵی ١٩٣٢ ڕزگار کردیە. خەڵکی ئاسایی کە سەرقاڵ بوون بە کاری خۆیانەوە، زۆر کەموکوڕیان لە کاری حکومەتدا نەدەدیت. زۆربەی ئەوانە نەیاندەویست کتێبە یاساغەکان وەخوێنن لەبەر ئەوە ئەگەر پێیان وترابا ناتوانن ئەم کتێبانە بخوێننەوە ئەوا هیچ جیاوازیەکی نەبوو بۆیان. خەڵکی ئەڵمانیا زۆر ئاگادار نەبوون لە ئوردوگا زۆرەملێیەکان و نەیاندەزانی چی کارەساتێك لەوێدا ڕوودەدات. ئەڵمانیەکان لە دوای ساڵی ١٩٤٢ وەخەبەرهاتنەوە واتە ئەو کاتەی جەنگ دەستی پێکرد کە ئیتر کار لە کار ترازابوو.



ئەو ژنانەی لە کاتی داگیر کردن هاوکاری ئەڵمانیەکانیان کردبوو، دواتر لە لایەن خەڵکەوە سزا دران.